ناوی کتێب: کچانی بەیبون

نوسین: هێلین خلیل

بابەت: هاندان

## پێشەکی :-

بەناوی خودای مەزن سوپاس و ستایش بۆ میهرەبانی و ڕزق و ڕۆزیەکانی سوپاس گوزاری پەروەرێنم کە دەرفەتی دام جارێکی تر دەست بکەمەوە بە نوسین و ئەوەی لە ناخ و دڵ و مێشکم دایە دایرێژم ...

دڵشادم کە جاری پێشوو لە کتێبی "گوفتار شیرین بە" کۆمەڵێ نامەی جوانم بۆ هات کە هانیان دام زیاتر خولیای نووسین بم لەگەڵ ئەوەی یەکەم جار بوو بنووسم بەڵام توانیم دونیایەك بابەتی جوان بخەمە ڕوو کە دەمێك بوو وەك ئەندێشە لە ناو ئاوەزما گوزەری دەکرد

نووسین هەستێکی تەواو جیاوازە کە هیچ کات ئەو هەستە پڕ چێژەم نەچەشتوە هەست بە بوونی خۆم دەکەم لە هەمووی تایبەت ئەوەیە شانازی دەکەم بە خۆم کە بوومەتە هۆی سوود گەیاندن و ئارامی بۆ چەندەها کەس،لەو نامیلکە بچووکە دەمەوێ هەندێ بابەتی هەستیار بخەمە ڕوو بۆیەش ناوم نا " کچانی بەیبون " چونکە بەیبون گوڵێکی نازدار و بۆن خۆشە کە پشت بە خۆی دەبەستێ لە گەشەکردندا چاوەڕێی هیچ کەس ناکات تا بێت خزمەتی بکات بەڵکو سەربەرزانە جوانی خۆی دەردەخا ، کچانی ئێمەش دەبێت وەك ئەو بەیبونە بن سەربەرز بژین شەرم لە مێینە بوونی خۆیان نەکەن چاوەڕێی ئەوە نەکەن کاتێ کەوتن کەسێ دەستیان بگرێت و لەسەر زەوی بەرزیان بکاتەوە وە کچ بوون نیعمەتێکی لە بن نەهاتووە چونکە دەبێتە دایك!

وە دەمەوێ باس لە زۆر شتی تر بکەم خوازیارم بە دڵی هەموو لایەك بێت وەك کتێبەکەی پێشووم بتوانم کۆمەڵێ پەیامی جوان بگەینم .

## ڕوونکردنەوە:

حەز دەکەم ئەو ڕەخنانەی خوێنەر بخەمە ڕوو کە لە ڕێگای هەردوو تۆڕی کۆمەڵایەتی فەیس بووك و ئینستاگرام ئاراستەم کراوە

هەندێك وتیان کە جۆری فۆنتەکە جوان نەبوو لەگەڵ ئەوەی هەندێ کێشە لە لاپتۆپەکەمدا هەیە بەلام لەبەر دڵی خوێنەر ئەمجارەیان جۆری فۆنتەکەم گۆڕی ، بۆ بابەتی خاڵبەندیش هەرچەندە تەواو لێی لێزان نیم بەلام زۆر زیاتر وورد بووم ئەمجارە وە هەروەها من بۆیە لەسەر بابەتی هاندان دەنووسم ئامانجم ئەوەیە چەند بابەتێ تێکەڵ بکەم نەك لەسەر یەك بابەت قسە بکەم وای دەبینم ئاوا زیاتر دەتوانم پەیامەکانم بگەینم .

ڕەخنەکانی خوێنەر وایان لێ کردم زیاتر بەرەو پێش بچم

زۆر سوپاسی پشتگیری هەموو لایەك دەکەم

بۆ هەبوونی هەر ڕەخنە و پێشنیارێك دەتوانن لە ڕێگای ئەکاونتەکەی خۆمەوە لە ئینستاگرام پەیوەندیم پێوە بکەن :

helen_khalil.o

1\3\2020

♥ هەولێر ♥

پەروەردگار جیهانێکی فەراهەم کردووە لە هەموو شتێك کە گرنگ و پەیوەست بن بە ئادەمیزاد و زیندەوەر بەڵام مرۆڤی لە پێگەیەکی بەرز داناوە بۆیە مەزنترین درووستکراو لەلای ئیلاهی مرۆڤە

گەر بێتو بۆ چەند چرکەیەك لە بەرامبەر ئاوێنەدا بنۆڕیتە کەمال و جەمالی خۆت گەورەیی بێ سنوری ئەو زاتە پیرۆزەت بو دەردەکەوێ سەیری چاوانت بکە کە لە هەر کەسێکدا جۆرێکی نەخشاندووە و ڕەنگی جیاوازی پێ داون کە دەتوانی ئەو هەموو شتە جوانانەی دونیای پێ ببینی سەیری برژانگ و برۆکانت بکە کە بۆ خزمەتی چاوەکانت درووستی کردوون

خودا دونیای لە دوو جۆرە ڕەگەز درووست کردووە نێر و مێ، پیاوانێکی مەزن ئێمەیان گەیاندۆتە ئەمڕۆ ئارەقەی نێو چەوانیان لە پێناو ئێمەدا ڕشتوە تاڵەکانی قژیان لە پێناو ئێمەدا سپی کردووە چرچ و لۆچی دەستەکانیان لە پێناو بژێوی ئێمە چرچ کردووە

پیاوەکان باوك و برامانن مام و خاڵمانن کە هەمیشە وەك پەرژین بوونە بۆ ئێمە ،هەمیشە لە پشت کچێکی بەهێز باوکێك هەبووە بۆیە هیچ کات لەگەڵ ئەوە دانیمە هەموو پیاوێك بە خراپ سەیر بکرێ چونکە کاتێ میهرەبانی باوکم دەبینم ئیتر واي نابینم هیچ پیاوێکی خراپ بوونی هەبێ

هەر لە توخمی پیاویش خودا ئافرەتی خولقاندووە کە خودا لە ئاسمانەکەی خۆی پیرۆزی کردووە پێگەی بەرزی داوەتێ چونکە دەبێتە دایك هەربۆیەش بەهەشتی خستە ژێر قاچەکانی.

بۆیە هیچ کات گلەيي لە کچ بوونی خۆت مەکە ئەزیزم ..

پێغەمبەری نازدار (ص) دەفەرمووێ :

" ڕقتان لە کچان نەبێتەوە ، بەڕاستی ئەوان ئارام بەخش و

خەم ڕەوێنن و گرانبەهان "

بیهێنە بەرچاوی خۆت ئەو ڕۆژەی لە دایك بووی باوك و دایکت چەندە کەیفخۆش بوونە بە هاتنە دونیات ، چەندین دڵۆپە فرمێسکی شادیان ڕشتوە ، چەندە شوکرانە بژێوی میهری ئیلاهیان کردووە .

باوکەکان هەست بە باوکایەتی ناکەن تا ئەو کاتەی نەبنە باوکی کچێك ، کچ بوون چەندە هەستێکی پڕ شانازی بوونە لە کاتێ دەبێتە درووستکەری خێزانێکی نازدارو پڕ لە خۆشبەختی

دەبێتە هێلانەی ئارامی پیاوێك...

دەبێتە گوڵزاری ماڵێكی پڕ لە موحیبەت...

دەبێتە سارێژی برینەكانی تەنهایي...

دەبێتە دایكی چەند منداڵێكی نازدار..

مەگەر ئێستاش دەتەوێ گلەیی لە كچ بوونی خۆت بكەی؟

تۆ كچی.....

تاجی شانازی بخەرە سەرت ، سەرت بەرز بكەوەو شانازی بە بوونی خۆتەوە بكە!

## نیعمەتی بە کچ بوون

کچان مەحبوبی باوك و گۆپاڵی دایکیانن

کە هەر لەگەڵ لە دایك بوونیانەوە خێرو خۆشی و ڕزق و رۆزی دەهێنن

کچانی بەیبون ئاسا تاجی شانازیان خستۆتە سەر ، کە لە هەموو بارودۆخێك پاڵپشتی دایك و باوکیانن لە هەبوون و نەبوون لە خۆشی و ناخۆشی لە گریان و پێکەنین هاوبەشی دەکەن

هەمیشە هەوڵی ئەوە دەدەن ببنە مایەی سەربەرزی بۆ خێزانەکانیان

وەك شەکراوی هەنگوینن بۆ براکانیان

هیچ ماڵێ لێوان نابێ لە شادی مەگەر کچێك هۆکاری شادیەکە نەبێ

ئافرەت بوون شتێکی پیرۆزە کە خودا وای کردووە پێگەیەکی بەرزی هەبێ لەم جیهانە

بەلاّم بەداخەوە هەندێ لە ئافرەتان هەر خۆیان وایان کردووە ئەو شکۆیە لە دەست بدەن

نرخی ئەو نیعمەتە نازانن کە خودا پێیي داون

هەر کاتێ ئافرەت شەهامەتی خۆی خستە ژێر قاچەکانی

هەر ئەو کاتە لە مێینە بوون وەدەر دەندرێ

هەر وەك ئەڤینی جوان نووس دەفەرمووێ :

ئەی کیژۆڵەی نەشمیلانە

هەمیشە پێبکەنە

با زەوی لێمان زویر نەبێ

مانگ ڕووناکی گووم نەکات

با تیشکی خۆر خێچ نەکات

بهێڵن کیژەکان پێبکەنن

زەوی گوڵی زەردی و پەمەیی گەرەکە

" ئەڤین کازم "

کچ بوون نیعمەتێکی لە بن نەهاتووە کە پەروەردگار سورەتێکی بە ناویەوە کردووە

کچ بوون ئەستێرەیەکی پرشنگداری ئاسمانی تاریکیە کە لە بەرزایی دەدرەوشێتەوە

چەندە جوانن ئەو کچانەی کە بەیبون ئاسا جوانیەکی دڵرفێنیان هەیە

وە کاتێ بتەوێ بۆنی بکەی دەبێ بۆی بچەمێیەوە .

## ئەو ئازادیەی کە کچان بە هەڵە لێی تێگەیشتون

وەك دەبینین ئازادی بوون لە ناو ئێمەی کچاندا بە جۆرێکی تر لێکدانەوەی بۆ کراوە ئازادی بوون بە خۆ ڕووت کردنەوەو دەرخستی جەستە تێگەیشتون، لەکاتیَ دا ئافرەت هەمیشە بە داپۆشراوی جوان بووە بگرە چێژ لە بینینی کچێك دەبینی کە دەبینی چەندە بە نازداری جەستەی بە داپۆشراوی هێشتۆتەوە

ئەزیزم...

ئازادی واتا متمانە کردنی خێزانەکەت

ئازادی واتا خۆت بی

ئازادی هەر ئەوەیە بتوانی لەسەر ئازادی بنووسی

ئازادی واتا بتوانی لە ناو ئاپۆڕای خەڵکدا بەهێزانە ووتار پێشکەش بکەی

ئەو کاتەی ئەوەت کرد کە خولیاتە

ئەو کاتەی ڕێگری شتێکت لیَ نەکرا کە هیوای داهاتووتە

ئەو کاتە ئازادی دەبینی

ئەو کاتە دەزانی ئازادی چەندە جوان و بیَ خەوشە

هەروەك ژان ژاك ڕۆسۆ دەڵێ :

ئازادی بەو مانایە نییە کە مرۆڤ هەرچی پێی خۆش بوو بیکات، بەڵکو بەو مانایە دێت مرۆڤ بۆ ئەو کارەی پێی خۆش نییە ناچار نەکرێ بە ئەنجامدانی .

کچان لە سەردەمی جاهیلیەت مافی ژیان کردنیان نەبوو هەر بۆیەش لەگەڵ لە دایك بوونیانەوە خێزانەکانیان هەستیان بە دروست بوونی پەڵەیەکی شەرمەزاری دەکرد بەسەر ناوبانگیانەوە وەك ئەوەی کچ درووستکراوی خودا نەبێ

ئەو حەز و خولیایەی کە کچ لە ناخی پەروەدەی دەکرد لەگەڵ خۆی دەیبردە ژێر گڵ و ژیانی بە زیندە بەچاڵ کردن کۆتایی پێدەهێندرا

لەگەڵ هاتنی ئیسلام ئەو دیاردە قێزەونە بن بڕ کراو ژیان بۆ ئافرەت گەڕاوە ، ڕیز و شکۆی خرا پاڵ ناوی ئافرەت

ئازادی هەر ئەوەیە کە بتوانی شان بە شانی پیاوان کار بکەی شەرم لەوە نەکەی کە بە مێیینە بوون لە دایك بووی، هەر بۆیە ئەو ئازادیەی کە ئێستا دەبیندرێ زۆر دوورە لە ناوی ئازادی!

وەك شوپنهاوەر دەڵێت :

ئازادی زۆر وەك خواردنی دەرمانی زۆر وایە لە کاتێکدا دەرمان بۆ چارەسەرە،بەڵام ئەگەر

زۆر دەرخواردی نەخۆشی بدەیت دەیکوژێت .

گرنگی مەدە بە قسەی ئەوانە کە دەیانەوێ ئازادیت بە شێوەیەکی هەڵە تێبگەینن

تۆ تەنها لە سنوری ئەو ئازادیە ڕەهایە بمێنەوە کە پێویستە بۆت

ئەوانەی دەیانەوێ بە حوکمدان بەسەر جلەکانتەوە ئازادیت هەڵسەنگێنن وەك ئەوەی ئازادی

ڕووتیت لێ قەدەغە کرابێ

ئەوە هیچترین حوکمدانە مەهێڵە قسەی هیچ کەس کارت تێبکات ئەو ئازادیەی لەلایان

خێزانەکەتەوە پێت دراوە بە لایەنی خراپە مەیقۆزەوە ، کچ بوونی خۆت مەشێوێنە

ئەو ناوە جوانەی کە خراوەتە پاڵت دونیایەك جوانی لە خۆیدا هەڵگرتوە

تۆ کچـــی....

کچی بەیبون..

جوانی ئافرەت لەو جلانە دانیە کە لەبەریان دەکات ئەو شێوازە  دەرکەوتنەی هەیانە

یان ئەو شێوە قژ داهێنانەی هەیەتی ..

جوانی ئافرەت لە چاوەکانیەوە دەبینرێت

لەبەر ئەوەی ئەوە دەرگای چونە ناو دڵیەتی

ئەو شوێنەی خۆشەویستی لێ نیشتەجێیە

جوانی ڕاستەقینە لە ئافرەتدا لە ڕۆحیدا ڕەنگ دەداتەوە

جوانی ئافرەت لەو گرینگی پێدانەیە کە بە خۆشەویستیەوە دەیبەخشێت

لەو سۆزەیە کە نیشانی دەدات و جوانی ئافرەت

تەنها زیاد دەکات و گەشە دەکات

بە تێپەڕبوونی ساڵەکان .

" Andrey Hepburn "

## کچـــانی بەیبون ئاســـا

گوڵە بەیبون گوڵێکی خۆرسکە کە لە تیرەی تێکەڵاوەکانە لە ناو سەوزایی دەروێتن بەرزیەکەی دەگاتە 30 سم بۆنێکی خۆشی هەیە وەك بۆنی سێو کە شیفایە بۆ چەندین نەخۆشی وە بۆ بواری جوانکاریش بەکاردێ کە ساڵانە لە وەرزی بەهاردا گەشە دەکا و جوانی بە سروشت دەبەخشێ، زۆرانێکی لە ئێمە ئاشق بە جوانیەکەی خۆی کردووە

کچانی بەیبون لەهەموو بارودۆخێك سەربەرز دەمێننەوە

بەهێزانە بەسەر سەختیەکانی ژیان سەردەکەون

کچان ئەو درووستکراوەن کە جوانی بە ژیان و بوون دەبەخشن

فریشتە ئاساکان لە بەرگی ئەو کچانەدان کە هەمیشە باش بوون خووی ژیانیان بووە

مەگەر هیوای کچێکی بەیبونی چییە؟!

تەنها چەند وەلاًمێكى سادە ....

گرینگى پیێ بدرێ

سۆز و میهرەبانى دایك و باوك وەك پەرژین بیێ بە دەوریەوە

تەنهـــا بیێ لە دلًى پیاوێك !

ئارام ئازاد دەلًیێ:

ئافرەت دلًێكى دەوێت

وەك تابوت بێت، جگە لە خۆى

جێگەى هیچ ئافرەتێكى ترى تێدا نەبێتەوە .

## هێز لە بەیبونەوە

کاتێك نوقمی دەریای ڕەشی بێ هیوایی بووی هەموو دەرگاکانی خۆشبەختیت بە ڕوودا داخرا

ئەوە لەبیر مەکە میهرو سۆزی ئیـلاهی بێ سنورە

سەراب ئاسا مەڕوانە هیوا

ئەو هێز و تواناییەی لە تۆدا هەیە بهێلە بێتە بوون

ئەو هیواو خولیایانەی لە ناخت دا باڵیان کێشاوە مەهێڵە بەبەردەم چاوانتەوە ببن بە سەراب

هێزی تۆ دەتوانێ کەونێك بژێیننتەوە

لە گێژاوی تاریکی و بێ هیوایی وە ئاگا وەرە

تۆ کچـــــی...

کە لە زۆر جەنگدا هاوشانی پیاو جەنگاوی

تۆ کچـــی...

کە هێز و توانای تۆ هیچ جیاوازیەکی نیە لەگەڵ پیاوەکاندا

بەیبون ئاســا... هێزی تۆ بێ سنوورە .

سۆفیا لۆرین دەڵێت :

هیچ شتێك بەقەد ئەوە ئافرەت جوان ناكات

كە خۆی باوەڕی وابێت كە جوانە !

درەختی تەمەن ، هەر ڕۆژەی گەڵایەكی دەوەرێت

لە پایزدا خەزانێك باوەشی پیادا دەكات و جوانیەكەی گووم دەكات

دیسان لە بەهاردا سرووشت بەرگی سەوز دەپۆشێت و ژیان دەبوژێتەوە

ئەگەر هێز و توانای ئێمە بەشی ئەوە ناكات لە پاش هەر شكستێ دیسان هەڵسینەوە

ئاخۆ دەبێ چی بگوزەرێ؟!

بەهێزەكان ئەوانەن لە دوای هەر بیابانێكی وشك هەڵاتوو مەیلی دووبارە ژیانەوە و سەوز بوون لە دەروونیان دەخولقێ .

با هێز لەو کچە بەیبونیە پەپولە ئاسایە فێربین کە هەر لەگەڵ لە دایك بوونیەوە لەگەڵ نەخۆشیەك جەنگاوە ،چاوەکانی لەگەڵ دونیایەك ئازار و غوربەت هەڵهێناوە

ئەو دایکە چەندە زەحمەتی کێشاوە چەندە دڵۆپە فرمێسکی نارەحەتی ڕشتوە کاتێ بەبەرچاوانی خۆیەوە ڕۆڵەکەی بۆتە بوکەڵەی ژێر دەستی دکتۆرەکان ،وەرزی تەمەن لە درێژی دایە ،بەرەنگار بوونەوە و دژ بە نەخۆشی جەنگان لەگەڵ ئازار ئەو کچەی گەیاندە سەرکەوتن

ڕازی تەمەن 25 ساڵان ئەو کچەی توشبوی نەخۆشی تەلاسیمایە کە چەندین هیواو داهاتوی پڕشنگدار ژیانی لا جوان کردووە ئەو کچە پەپولە باڵ نەخشاوەی کە لە هەموو چرکەکانی تەمەنی بۆ جارێکیش بێ هیوایی چۆکی پێ نەداوە لەگەڵ ئەوەی چەندین لە هاوڕێکانی لە دەست دا کە هەمان نەخۆشی ئەویان هەبووە بەڵام بۆ جارێکیش سکاڵای لە نەخۆشی خۆی نەکردووە لە بەرامبەر پەروەردگاری گەردوون

هەمیشە سوپاس گوزاری موحیبەتی ئیلاهی کردووە کە یەکێك بووە لە خۆشەویستانی ئەو زاتە مەزنە چونکە بەو جەنگە تاقی کردۆتەوە

ڕازی لێوان لێو لە هێز بەهۆی سەختی نەخۆشیەکەی چەند سالێك لە خوێندن دواکەت

بەڵام ئەو نەخۆشیە برستی لێ نەبڕی، گڕوتینێکی بێ سنوور ناخی تەنی بوو

ڕەشەبای ڕۆژگار ڕازی بەرەو هەڵدیرێکی چاوەڕوان نەکراو برد

پاش زەحمەتیەکی تاقەت پڕوکێن توانی زۆر بەسەرکەوتوانە زانکۆ بەدەست بهێنێ .

ڕاز......

ئێستا دڵبەری زۆرێك لە قوتابیانی زانکۆی صلاح الدین ە

ئەو دایکەی ژیانی لە پێناوی دانابوو ئێستا شانازی دەکات بە شکۆ و ئازایەتی ئەو ڕۆڵەیەی
وە ڕاز قەرزی بەشێك لەو میهرو سۆزەی دایکی بەسەرکەوتن داوە

فەلسەفە چەندە بەبەختە لەکاتیٚ ڕاز خوێنەری بەشەکەیتی

هێز و توانا چەندە جوانە کاتیٚ بەرهەمەکەی دەبینی ، غەم و دڵتەنگی بارگەی پێچاوەو ئیتر
لەبەر چاوان گووم بوو چونکە جێگایەکی شك نەبرد لە ژیانی ڕاز دا

کچەی بەیبون ... ڕازی جوان

تۆ نموونەی هێز و توانای .

## خۆزگـەی کچـــەکان

کچەکان ئەو بوونەوەرە پڕ لە میهرەبانیەن ، کە لە پشت هەزاران زەردەخەنە

کەسەرێك دڵەکانیان تەنیون ...

ئەو کاتەی دڵەکان ئۆقرە ناگرن ، چاوەکان ناتوانن پێڵوەکانیان لێك بنێن

سۆز و ئەوینێك شك نابەن ، لە نێو حەشاماتی ئەو گەردوونە تەنیایی دەبێتە میوانی ڕۆحەکان

کچەکان لە گەڵ هەبوونی دونیایەك ئازار هێشتا ووتنی : من باشم!

وێردی سەر زاریانە

خۆزگەی کچەکان چەندە سادەیە

هەر ئەوەی لەلایان ئازیزانیانەوە فەرامۆش نەکرێن

ئیدی تەواوی ژیانیان دەبێتە گوڵزار

کچەکان لە باران دەچن ، نەرم نەرم لە بەخشینی عەشق

پاك و بێ خەوش لە میهر و سۆزیان

کچەکان ....

بە دزیەوە ئەسرین دەبارێنن

لێوە هەڵقرچاوەکانین بە زۆر دەهێننە بزە!

خۆزگەی کچەکان زۆر بە دەگمەن بەلای ئەوەوە دەچێت، کە سامانی دونیا هەموو موڵکی ئەوان بێت

زەردەخەنەیەکی دایك و باوك و گرینگی پێدانەکانیان و میهرەبانی برا

خۆزگەی زۆرێك لە کچەکانە

کچەکان مەشکێننەوە

مەیان ڕوخێنن

کچەکانیش مافی ژیان کردنیان هەیە

بە گوفتاری نا پەسەند ئەو دڵە بچکۆلانەیان ئازار مەدەن

کاڵفامانە رەخنە مەگرن لە شتانێك کە لە دەستی ئێمەی بەندە نیە

کچەکانتان خۆشبوێت !

کچەکان باخچەیەك لە بەیبون لەسەر ئازارەکانیان دەڕوێنن

خۆڕاگری و هێز ناتوانێ دڵانی پڕ لە هیوای کچەکان شلۆق بکات

ئەو دونیایەی کە تێیدا میوانین ناکرێ هەمووی وەك ئەوە دەوران بکات کە ئێمە دەمانەوێت

مشتێ لە بەخششی سۆزی ئیلاهی جێگەی هەموو ئەو ئازارانە پڕ دەکاتەوە کە

ڕۆچوونەتە گیان و دڵەوە

کچەکان هەمیشە و هەمیشە سەربەرز ماونەتەوە

لە دوای هەزاران شکست و ناڕەحەتی

تەسلیم نەبوونە !

هەڵسانەوە پیشەی ئێمەی کچانی پڕ لوتف و شەرمەزارکردنی نوشستی بووە

ئێمەین کچانی بەیبون .

مەولانای دڵان دەفەرمووێ :

" دڵنیابە ڕۆژگارێك دێت هەر ئەو ئازارە دەبێتە مەرهەمێك بۆت "

ڕەوەز جەمال دەڵێ :

هیچ مرۆڤێك بێ ئازار نایەتە سەر ئەم گۆی زەویە

مرۆڤ هەیە لە ئازار ڕادەکات

تا خۆی لێ وندەکات

مرۆڤ هەیە بکوژی ئازارە ، مرۆڤ هەیە لەگەڵ ئازار ڕادێت

مرۆڤ هەیە تا کۆتایی تەمەنی

ئازار هەموو ڕۆژێکی پڕ دەکات

لە وردە مردن ، مەبە بە بخورێکی باشی ئازار

لەگەڵ خۆتدا مشتێ هیوا هەڵگرە

تا ڕۆخی شادترین مرۆڤی دونیا بچۆ

بەیانیان با سەمای پەپولەکان دڵخۆشت بکات و

لەکاتی شەودا هاتنیش لە ئەستێرەکان ڕابمێنە و

دەکرێ...

پڕشنگی ئەوان شەوێك لە ئاسمانەکان ون ببێت

وەك ونبوویەك لە سیما و ڕووخساری تۆدا بدۆزێتەوە

سەبرگەیەك بخولقێنە تا هەنگاوی لەرزۆکت دەگاتە

ئەوسەری خولیا و ئاواتەکانت .

با ئێمەی کچ

ببینە کانگای هیوا و بەخشینی عەشق

با ببین بە بە یەکێك لەوانەی کە لە تاریکترین شەودا چران

لە ساردترین شەوە زەنگی زستاندا گەرمی و سۆز و میهرەبانین

هیوای ساتە دژوارەکانی ئەو زەمەنە پڕ سەختیەن

هاوڕێی ڕۆحە ماندووەکانن

با دڵێکی سپی ڕۆژگارە ڕەشەکان بین

چەپکێ بەیبونی نێو خەزانی تەمەن بین

ئەویندارى دڵە مەستەکانی تاریکی بین

بۆن و بەرامەی بەیبون بڕشێنین بەسەر تەواوی دڵەکاندا

تاڤگەیەك بین لە میهرەبانی

خەرمانێك بین لە گوڵزاری موحیبەت

وەك پەڕەی گوڵ ناسك ناسك

هێمنانە وەك پەپولەی باڵە فڕە

تۆی هیواو خۆڕاگری بچێنین لە نێو دڵەکاندا

یادی ئیلاهی ئاوێتەی ڕۆحەکان بکەین

بەهەشتێك بخوڵقێنین کە هیچ کەس مەیلی ڕۆیشتنی نەکا !

فرمیـسکی 13 ساڵان کە بە تابلۆیەکی ڕەش و تاریك چاوەکانی بە دونیا هەڵهێنا

هاتە بوونی ئەو کچە پاکە کەیفخۆشیەکی بێ سنووری بە دایك و باوکی بەخشی

بەڵام بەداخەوە پاش یەك هەفتە دەرکەوت کچەکەیان نابینایە و هیچ کات ناتوانێ ببینێ

بەلاّم خێزانەکەی فرمێسك نەوەستان لە سەردانی کردنی دکتۆرەکان تەنها بۆ ئەوەی

هیوایەك هەبێ

بەداخەوە هەموو کات بە دلّێکی پڕ لە حەسرەت و ڕووخسارێکی ماتەوە دەگەڕانەوە مالّەوە

سالاّن هات و سالاّن رۆشت ئەو کچە خنجیلانەیە گەشەی کردوو زمانی بە قسە هات

ئیتر دەیتوانی ووشەکان دەرکات

فرمێسك ئەوەندە خۆشەویست بوو لای دایك و باوکی ئەوەندە گرینگی پێدەدرا

کە هیچ کات درکی بەوە نەکرد شتێك لەو کەمە

هەستی بەوە نەکرد کە ئەو بێ بەشە لە بینایی

بێ بەشە لە دیمەنی خۆرئاوا بوون باڵە شەقەی بالّندەکان

فرمێسك هیچ کات نەیتوانی ئەوە ببینی کە لە پاش هەر بارانێکی بە ریژنە

شەبەنگەکان لە ئاسمان دەدرەوشێنەوە .

بێ بەش بوو لە سیما و ڕووخساری دایك و باوکی

کەچی لەهەمبەر ئەوەشدا ئەو بە دەست لێدان دەیتوانی ڕەنگەکان بناسێتەوە

زۆرجاران دەیووت دایکە ..

هەرچیت بۆ کڕیم با ڕەنگی پەمەیی بی!

پەمەیی چەندە شەرمەزارە کە ئاشقانی بگرە دەتوانن بە هەستە دەمارەکانی سەری پەنجە

هەستی پێبکەن و لە نێو تەواوی ڕەنگەکان بیناسنەوە

خۆزگەی ئەم کچە پەپولە ئاسایە لە خۆزگەی هەزاران کچی تر جیاوازبوو

خۆزگەی ئەو تەنها هەبوونی بینایی بوو

بۆ ئەوەی تەواوی ئەو شتانە ببینێ کە بوونی هەیە

ئەزیزم....

دەی ئیتر سوپاسی یەزدانت بکە ئەگەر لەو نیعمەتە بێ بەش نی!

سوپاسی میهر و سۆزی بێ سنوری ئیلاهی بکە کە وەك تاڤگەیەك دەڕژێت بەسەرماندا

لەگەڵ هەموو نزاکانتدا سوپاسگوزاری دەربڕە بۆ هەموو ئەو نیعمەتانەی کە خاوەنی

فرمێسك بۆ ڕۆژانێك دابارێنە کە دوور لە نوری ئیلاهی و

چرای ئیمان و تاریکی و بێ ئاگایی بەسەرت بردووە

ئەو کاتانەی هیوا لە فەرهەنگت دانەبووە کوچ و کەڵێنێت شك نەبردووە کە ڕازی دڵتی لا باس بکەی ، خودا تاکە گوێگرت بووە

سوپاس گوزار بە.....

کە سامانی ڕۆحت پاکیە

ئاوێتە بوونی دڵت خۆشەویستیە

چەندە پڕ چێژە ئەو ساتانەی لەبەردەم میحرابی یەزدان دەستەکانت بەرز دەکەیتەوە

داوای هەموو ئەو شتانەی لێ دەکەی کە دەتەوێ

بێ ئەوەی ئەو داوای هیچ بەرامبەرێکت لێ بکە

خۆشەویستی ئیلاهی بێ بەرژەوەندیە

دەوڵەمەندترین هەست ئەوەیە کە بەندەیەکی ئەو زاتەی پیرۆز و زێدە دەسەڵاتدارەی

کە هیچ کات پشتت لێ ناکات .

ئافرەتێك بە دەوری کەعبە تەوافی دەکرد و بە کوڵ دەگریا ، بە سۆزێکی بێسنوور و

دڵێکی شکاو بە دەم نزا و لالأنەوەوە فرمێسکی گەرمی دەڕشت..

لێیان پرسی : پێدەچێت کەسێکی زۆر ئازیزت لە دەستدابێت؟!

گوتی : لەوە ئازیزتر ! من دڵی خۆمم لە دەستداوە ، من وێڵی خۆشەویستەکەی خۆمم

بە هۆی گوناه و تاوانەوە لە دەستمدا....

"وەرگیراوە لە کتێبی نامە نورینەکان"

کاتێ لە سۆز و خۆشەویستی و یادی ئیلاهی دووردەکەوینەوە ئەو کات دەزانین بێ ئەوی

چەندە زەلیلمان دەکات، چەندە بێ هیواو سەرگەردانمان دەکات

ژیان کردن دوور لەیادی ئیلاهی تاڵیەك دەبەخشی کە هیچ کات ناتوانی شیرینیەکی بدۆزیەوە

با ئیتر ئەو غرورە بشکێنین ئەوە بەبیر خۆمان بێنینەوە کە ئێمە لەو دونیایە دا نامۆین و

ڕێبوارێکی شەکەتین

با یەکێك بین لە خۆشەویستانی پەروەردگار .

## بە کەلتور کردنی خوێندنەوە

ئاوێتە بوون لەگەڵ دونیایی کتێبدا یەکێکە لەو ڕێگایە زێدە گرینگە و پڕ بەرهەمەی کە مرۆڤ بەرەو لوتکەی ڕۆشەنبیربوون و سەرکەوتن دەبات، کە لەو ڕێگایە تێروانینی بۆ ژیان و دەوروبەری باشتر دەکات

خوێندنەوە ڕۆڵێکی گرینگی هەیە بە فراوانکردنی بیر و هزری تاکەکان، چونکە خوێندنەوە هۆکارێکی کاریگەرە بۆ بەهێزکردنی توانای قسەکردن و گفتوگۆ وە گەشە بە بیرو هۆش و

هەڵسوکەوتی مرۆڤ دەدات و هۆشیاری پێدەبەخشێت و وەك خۆراکێکە بۆ ڕۆح ، کتێب ڕێگای تاریکیت بو چراخان دەکات ، بۆ ئەوەی ژیانت بەر ڕۆشن بکەی خوێندنەوە بکە بە پیشەی هەمیشەییت

ستیل دەڵێت : " خوێندنەوە وەرزشی هۆشە "

کتێبەکان ئارامی دەبەخشن بە دەروون، مرۆڤ دوور دەخەنەوە لە تورە بوون و بێ موراڵی

کتێبەکان هەستی متمانە بەخۆبوون لە مرۆڤدا درووست دەکەن وە چەشنە هاورێیەتیەکت پێ دەبەخشن لە گشت سات و بارودۆخێکدا تەنیات ناکەن

خوێندنەوە بەشێکی گرینگی ژیانە کە پێویستە کچان بیکەنە چرای فکر و کڵپە بە هزریان بدەن ، کتێب فریادرەسی ئەوانەیە کە کەشتی ژیانیان نقومی بێ هیوایی بووە .

مهران مدیری دەڵێ :

خۆزگە کتێب خوێندنەوە مۆدێل بوایە ، بزانە هەموومان دەستمان نەدەکرد بە کتێب خوێندنەوە .

با خوێندنەوە بکەین بە کەلتور لە ناو کچاندا ئەگەر تا ئێستا هیچ کتێبێکت نەخوێندۆتەوە

ئەوە لەو ساتەوە دەست پێ بکە هیچ کات درەنگ نیە بۆ دەست پێ کردن

بۆ دەست پێکردن دەبێت بەرنامەت هەبێت تاوەکو هەم چێژ لە خوێندنەوە وەربگری هەم لێی سوودمەند بی ...

باشترین خوێندنەوە ئەوەیە لەو بوارە بخوێنیەوە کە دڵخوازتە ، ئەو بوارە هەڵبژێری کە تێیدا ئاسوودەی ، زنجیرەیەك لە کتێبی بەسوود دابنێ ئەگەر ڕۆژانە یەك لاپەڕەشت بۆ بخوێندرێتەوە !

لەکاتی خوێندنەوە هەوڵ بدە هەموو فکر و هزرت لای کتێبەکەت بێ بە مێشکێکی خاڵی و دوور لە جەنجاڵی و هەژاوی دابی ، زۆران لە ئێمە کێشەی لەبیرچوونەوەیان هەیە

ڕێگایەکی باش بۆ ئەوەی پوختەی ئەو کتێبەت بیر نەچێت کە دەیخوێنیەوە لە پارچە کاغەزێکی بچووك ئەو ڕووداو و ووتانە بنووسە کە سەرنجت ڕادەکێشی یانیش ناوی کارەکتەرەکانی ناو کتێبەکە بنووسە بۆ ئەوەی هەم بیرت نەچێ و هەم بتوانی بۆ کەسێکی باس بکەی کە پرسیاری ناوەڕۆکی کتێبەکەت لێ دەکات .

خوێندنەوە بۆ کچانی بەیبون ئاسا زێدە پێویستە زۆرێك لە کچان بۆشایەکی رۆحی لە ناخیان دا درووست بووە پێویستیان بە قسەکەرێك هەیە بۆ ئەوەی لە شلۆقی مێشك و جەنجاڵی رۆح دەربازیان بکات .

کتێبەکان مرۆڤ گەلێکی کارامە و لێزانیان درووست کرد، کە بوونەتە پێشەنگ بۆ ئێمە

هەر کتێبێك گوزەرێکە بە ناو جیهاندا ..

داردین دەڵێ :

" تۆ لە ماڵی خۆت دایت و بە خوێندنەوەی کتێب

گوزەری جیهان دەکەیت "

لەیەکێك لە نووسراوە هەڵکوڵدراوەکانی سەر دیواری فیرعەونییە میسریەکان نووسراوە :

" رۆڵەکەم وات لێدەکەم کە چۆن دایکت خۆشدەوێ

ئاواش کتێبت خۆشبوێت "

## دەتوانی خۆت بگۆڕی!

بۆ بەرەو پێش بردنی رۆح و ئاوەزت دەتوانی گۆڕانکاری لە زۆر شتدا بکەی

با ئیتر کچەکان واز لەو ووشەیە بهێنن کە دەڵێن ئیتر فێربوومە یان ئەوە سروشتی منە !

هیچ بیانوێك جێگای قەبوڵ کردن نیە ...

گەردوون پڕ پڕە لە بەرزی و نشێوی

ئیتر واز بێنە لە لۆمە کردنی دەوروبەر

گلەیی ئەوە مەکە بۆچی کەسانی تر وەك ئەوە هەڵس و کەوتت لەگەڵ ناکەن کە تۆ دەتەوێ

کچانی خۆراگر و پڕ لە ووزە پێش ئەوەی راپۆرتیك لە گلەیی و

نارەزایی کردن لە ژیان دابڕێژن هەوڵی گۆرانکاری لە خۆیان دەدەن

کچانی فریشتە ئاسا.. دونیا وەك ئەوە ناگوزەرێ کە تۆ دەتەوێ

بەڵکو تۆ هەوڵی خۆگونجاندن بدە لەگەڵ زەحمەتیەکان

دەست هەڵگرە لە نەفرەت کردن !

ئاسۆ ڕوون بڕوانە و هەوڵی چارەسەری تەواوی ئەوانە بدە کە ڕێگرن لەوەی

دەست بە گۆڕان بکەی .

لیندا پرین سایپ دەڵێ :

گەرچی ژیان ئامیاری غەم و ئازارە

بەڵام ڕێگە لە خۆشی و شادمانیش بێبەری نیە

ئەگەر دونیایي خۆت داڕووخاو بینی

پارچە ساغەکانی هەڵبگرە و درێژە بە ڕێگەکەت بدە

چونکە لە کۆتاییدا ، ئاواتەکانت بەدی دێن

لە یادت بێ!

کە لە کۆتاییدا هەر ئەو بەرز و نزمییانەن هاوسەنگی بە یەکدی دەبەخشن

ڕێگە بدە فرمێسکەکانت بێن

با خونچەی بزە لەسەر لێوت بپشکوێت

بەڵام ملکەچ بوون .. هەرگیز ، هەرگیز

لەیادت بێ ، کە لە تۆدا وزەیەك هەیە کە مزگێیندەری هاتنەدی خەونەکانتە

تەنانەت ئەو کاتەی کە زۆر دوور دیارن

## هەستی بوون بە دایکایەتی

کاتێ بە مێنە بوون لە دایك بووی زۆر شتی جوان و پڕ لە لوتفی ئیلاهی چاوەڕێت دەكات

لە دایك بوونی تۆ نیعمەت بوون و شكۆ دەبەخشێ بە دایك و باوكت

لەبەرامبەر قسەیەكی ناخۆشی دایك كاردانەوەی توند و شكێنەر مەنوێنە

ئەو دایكەی نۆ مانگ تۆ لە سكیدا هەڵدەگرێت

ئەو خواردنەی دەیخوات لەگەڵ تۆ هاوبەشی پێ دەكات

ئەو دایكەی شەوانەی تا بەیانی ئازار ناهێلی خەو میوانی چاوەكانی بێ

جولەی تو تاقەت و ئارامی لێ دەشێوێنی ..

تەنها بۆ ئەوەی تۆ بە سەلامەتی بێیتە دونیا ...

بەرگەی دونیایەك ئازار دەگرێت..

ئەو كاتەی لە رۆحی دایكت جیا دەبیتەوە دیـێتە دونیاوە

دایكت فرمێسكە گەرمەكان و سیمای تۆ ئازاری بیر دەباتەوە

هەرچی بكەیت ناتوانیت قەرەبوی ئازاری یەك شەوی بدەیتەوە

تۆی كچ..

كاتێ دەگەیتە ئەو قۆناغەی كە خێزانێك بنیات بنێی

ئەو ساتەی منداڵێك لە ناو رۆحتدا دەخولقێ

شەو و رۆژەكانت پڕ دەكات لە ئازار

ئەو كاتەی هەستی دایكایەتی بوون دەچێژی

وەك شانۆیەك ئەو كاتانەت دێتە بەر چاوان

كە چەندە بێ نمەكیت كردووە بەرامبەر دایك ئینجا باوك

ئەو كاتە زۆر درەنگ دەبێت بۆ داوای لێ خۆشبوون

كاتێ كچەكەی خۆت گرتە باوەش

هەستت بە لێدانی ترپەی دڵە بچووكەكەی كرد

بیرت دەكەوێتەوە دایكت بەهەمان ئەندازە خۆشی ویستووی

ئەو كاتەی لەگەڵ كچەكەتدا دەبێتە دەنگە دەنگت بە هۆی ڕەفتارێكی ناشرینی

تەنها بۆ ئەوەی دووری بخەیتەوە لە خراپە و رێگای هەڵە

بیری خۆتی بخەرەوە دایكت هەمان شتی دەویست

بەڵام تۆ هەمیشە دەنگت بەسەریدا بەرز دەكردەوە و دڵیت دەشكاند!

## کچان لە تابلۆی ڕەخنەدا

تۆ هەر چیت کرد ئەوان ڕەخنەیان گرت

بۆ هەر پۆشینی جلێك و هەر جۆرە ئارایشێك

ڕەخنە بارانیان کردی !

بە جەهـــەنەم!

بەجەهـــەم ئەوان چی دەڵێن و چۆن بیر لە تۆ دەکەنەوە

تۆ بۆ ئەوە نەخولڨاوی ئەوە بکەی کە خەڵك دەیلێ

ئەوە بکە کە خۆت دەتەوێ!

متمانەت بە هەموو ئەوانە هەبێ کە لە تۆدا هەیە

تۆ ناتوانی خۆشەویستی هەمووان بی

ڕقت لە خۆت نەبێ لەبەر ئەوەی ئەوان ڕەخنە دەگرن

بە کینەوە سەیری ڕووخسارت مەکە کە ڕەخنەی ئەوەیان لێ گرتی کە جوان نی!

ئەو جلە فڕێ مەدە کە زۆر لات جوانە تەنها لەبەر ئەوەی پێیان ووتی لێت وەشاوە نیە!

ئەوەندەی گرینگی بە قسەی خەڵك دەدەی

ئەگەر بێت و بە خۆتی بدەی ژیانت بە لایەکی تردا هەڵدەسورێ

دوورکەوە لەو خەڵکانەی کە هەمیشە هەستی کەم بوونت پێ دەبەخشن

ئیتر ئەو ماسکە فرێ بدە!

کە لەبەر خەڵکی لەسەر سیما و رووکاری خۆتت داناوە

تەنها بۆ ئەوەی تۆیان بە دڵ بێت وە رەخنەت ئاراستە نەکەن

خۆتت خۆشبووی ...

نەك قسەی خەڵکی

تەمەنی خۆت بەفیرۆ مەدە بۆ کەسانی تر

لەگەڵ ئەو کەسانەدا ژیان بکە

کە تۆیات قبوڵە وەك ئەوەی کە هەی

ئەوەی تۆی بە دڵ نەبوو

بە جەهـــەنەم!

رق و کینەکان فرێ بدەن ، چێژ لە ژیان وەرگرە

هەر ئەوەی ئەو دێرەت خوێندەوە بە ئازیزێکت بڵێ

♥ خۆشم دەوێی♥

-

# کۆتایی

الحمدللّە کە گەیشتمە کۆتایی توانیم پاش ماندوو بونێکی زۆر تەواوی بکەم

انشااللّە بە دڵی هەموو لایەك دەبێت و سوود مەند دەبن لێی

وە من لە نووسینەکانم جگە لە ووتەکان کە ئاماژەم بە ناوی نووسەر کردووە

گشت ووشە و دێر و بابەتەکان هی خۆمە

کە جاری وا هەبووە بۆ دۆزینەوەی تەنها ووشەیەك نزیکی کاتژمێرێك بیرم کردۆتەوە

لە کەم و کوڕیم ببورن هیچ کەسمان کامڵ نین

1/4/2020

بە هیوای سوود بۆ هەموو لایەك